حکومەتا هەرێما کوردستانێ – عیراق

وەزارەتا پەروەردێ

رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# کۆمپیوتەر

## مایکرۆسۆفت ئەکسس

## بۆ پۆلا یازدێ ئامادەیی

**دانان**

سۆران نەریمان حمە صالح — ئومێد صادق عبدالکریم

محمد ئەبوبکر تۆفیق — هادي حمە رەضا عزیز

روناک محمد عبدالله — رێزان حمە رەشید کریم

**هاتییە کرمانجیکرن ژ لایێ**

سربست توفیق عارف — مصطفی سلیمان محمد

غریبة شعبان عمر

**پێداچوونا زمانی**

طه یاسین طه

**پێداچوونا زانستی**

سگڤان حسن علي

چاپا سێیێ — ٢٧١٥ کوردی — ٢٠١٥ زایینی — ١٤٣٦ مشەختی

## *Auto Form Columnar

بۆ دروستکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بشێوازەکێ ستووینی دهێتە بکارئینان. پێنگاڤێن دروستکرنا فۆرمان بڤێ رێکێ دێ بڤی شێوەی بن:

١- (Auto Form Columnar) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.




٢-دۆگما (OK) کلیك دکەین، فۆرم ئێکسەر دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:



تۆمارا ژمارە (١)



تۆمارا ژمارە (٢)



تۆمارا ژمارە (٣)



تۆمارا ژمارە (٤)

## *Auto Form Tabular

بۆ دروستكرنا فۆرمەكێ بشێوەیەكی ئۆتۆماتیكی و بشێوازەكێ خشتەیی دهێتە بكارئینان. پێنگاڤێن دروستكرنا فۆرمان بڤێ رێكێ دێ بڤی شێوەی بن:

١- (Auto Form Tabular) كلیكدكەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانكەین.




٢-دۆگما (OK) كلیكدكەین، فۆرم ئێكسەر دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:



## *Auto Form Datasheet

بۆ دروستکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکێ ئۆتۆماتیکی و بشێوازێ شیتەکێ ئێکسلی دهێتە بکارئینان. پێنگاڤێن دروستکرنا فۆرمان بڤی رێکێ دێ بڤی شێوەی بن:

١- (Auto Form Datasheet) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.




٢-دۆگما (OK) کلیکدکەین، فۆرم ئێکسەر دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:



| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایک بوون | ئایا پەککەفتیە | قەزا | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/197 | ☐ | دهوک | Bitmap Imag |
| 2 | بهار احمد ابراهیم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/198 | ☐ | دهوک | Bitmap Imag |
| 3 | احسان محمد سلیمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/196 | ☐ | زاخو | Bitmap Imag |
| 5 | کوردستان کمال انور | ئەندازیار | $550.00 | 1 | 20/03/198 | ☐ | دهوک | Bitmap Imag |
| 6 | کامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $480.00 | 3 | 11/12/196 | ☑ | دهوک | |
| 7 | حسین ابراهیم کریم | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/197 | ☐ | سێمێل | |
| 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/197 | ☐ | ئامێدیێ | |
| (AutoNumbe | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

## *Auto Form Pivot Table

ب ڤێ ڕێکێ دشیاندایە فیلدان لدووف حەزا مە بکاربینین بۆ دروستکرنا فۆرمی وبقی شێوێ لخوارێ دیارکری:

١- (Auto Form Pivot Table) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.




٢-دۆگما (OK) دێ کلیك کەین، فۆرم ئێکسەر دێ بقی شێوەی بەرچاڤبیت:



پاشان برێیا راکێشان وبەردانێ بکلیکا چەپێ یا ماوسی ئەو فیلدێن مەبەست پێ دێ ڤەگوهێزین بۆ ناڤ پەنجەرێدا، بڤی شێوەی بەرچاڤدبیت:



## *Auto Form Pivot Chart

بۆ دروستکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکێ ئۆتۆماتیکی و بشێوازێ هێلکارەکێ رێکخستی دهێتە بکارئینان. پێنگاڤێن دروستکرنا فۆرمان بڤێ رێکێ دێ بڤی شێوەی بن:

١- (Auto Form Pivot Chart) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.



٢-دۆگما (OK) كليكدكەين، فۆرم ئێكسەر دێ بڤى شێوەى بەرچاڤبيت:




پاشان برێيا راكێشان وبەردانێ بكليكا چەپێ يا ماوسى ئەو فيلدێن مەبەست پێ ديار بكەين دناڤ هيلكاريدا دێ كێشينە جهێ مەبەست پێ، بڤى شێوەى.



## *Chart Wizard

ئەڤ ڕێکە بۆ دروستکرنا فۆرمی بشێوێ هێلکاری دهێتە بکارئینان. بڤی شێوەی:

١- (Chart Wizard) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.




٢- دۆگما (OK) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسا لخوارێ دیار بەرچاڤدبیت، دشیاندایە وان فیلدان هەلبژێرین ئەوێن مەبەست پێ کو بدانینە دناڤ تۆرا هێلکاری وبڤی شێوەی:



٣- دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە دناڤدا شێوازێ هێلکاری دەستنیشانبکەین:




٤- دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە دناڤدا فیلدێن هەلبژارتی ڤەگوهێزین بۆ جهێ مەبەست پێ دناڤ هێلکاریدا:



**تێبینی:**

دشیاندایە بڕێکا Preview Chart هێکاری ببینین.

٥-دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە ناڤەکی بدەینە فۆرمی.




٦-دۆگما (Finish) کلیکدکەین، هێلکاریٚ مە دیٚ بشێویٚ دیار کری هێتە دروستکرن، کو دشیاندایە گوهۆڕانکاریا دناڤ هێلکاریدا بکەین ژ ئالییٚ رەنگ وقەبارە وجۆریٚ نڤیسینیٚ ئەوژی بڕێیا جووت کلیککرن لسەر وی بەشیٚ مەبەست پیٚ.




## *Pivot Table Wizard

بڤێ رێکێ دشیاندایه فیلدان لدووڤ حەزا مە بکاربینین بۆ دروستکرنا فۆرمی وبڤی شێوەیێ لخوارێ دیارکری:

١-(Pivot Table Wizard) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.



٢- دۆگما ( OK) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت:




٣- دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە بڕێیا وی (خشتەی یان پرسگەهـ) یان فیلدێن مەبەست پێ بۆ فۆرمی دیاربکەین.




٤-دۆگما (Finish ) کلیکدکەین ، فۆرمەك بڤی شێوەی دهێتە دروستکرن.




پاشان بڕێیی ڕاکێشان وبەردانا کلیکا چەپێ یا ماوسی فیلدێن مەبەست پێ دێ هێنە کێشان بۆ ناڤ تۆڕا فۆرمی.



## چوار/ ڕاپۆرت Reports

دهێتە بکارئینان بۆ بەرچاڤکرنا زانیاریێن دەستنیشانکری ژ ناڤ داتابەیسێدا (بنکا زانیاریان) بشێوەیێ ڕاپۆرتەکا چاپکری یان ژی هنارتنا راپۆرتێ بۆ پرۆگرامەکێ دی وەك (مایکرۆسۆفت وورد، مایکرۆسۆفت ئێکسل، ... هتد)، ب ڤی شێوەیێ لخوارێ دیار کری دشیاندایە راپۆرتەکێ دروستبکەین:

### *Design View

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا راپۆرتێ لدووف حەزا مە دهێتە بکارئینان، بڤی شێوەی:

١- (Design View) کلیکدکەین، خشتە یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشان دکەین.




٢- دۆگما (OK) کلیکدکەین، بۆکسەك بەرچاڤدبیت کو دبێژنێ تۆرا دیزاینا راپۆرتێ، دشیاندایە فیلدێن مەبەست پێ د راپۆرتێدا دیاربن برێیا راکێشان وبەردانێ ب کلیکا چەپێ یا ماوسی ڕاکێشینە دناڤ تۆرێدا بۆ ناڤ پشکا ناڤەرۆکێ (Details) دا.




**تێبینی :** تۆڕا راپۆرتێ ژ ڤان پشکان پێك دهێت.

أ-(Report Header): زانیاریێن ڤێ پشکێ بتنێ ل بەرپەڕێ ئێکێ یێ راپۆرتێ بەرچاڤدبن، بۆ دیارکرنا ناڤێ راپۆرتێ دهێتە بکارئینان.

ب-(Page Header): زانیاریێن ڤێ پشکێ ل ئالیێ سەری یێ هەمی بەرپەڕێن راپۆرتێ بەرچاڤدبن، وەکو نموونە بۆ دیار کرنا ناڤ ونیشانێن فیلدان دهێتە بکارئینان.

ج-(Details) : بۆ دیار کرنا زانیاریێن ناڤەرۆکا راپۆرتێ دهێتە بکارئینان. وەکو نموونە فیلد دناڤ ڤێ پشکێدا دهێنە دانان.

د- (Page Footer) زانیاریێن ڤێ پشکێ ل ژێریا هەمی بەرپەڕێن راپۆرتێ بەرچاڤدبن، وەکو نموونە بۆ دیار کرنا ژمارا بەرپەری.

هـ- (Report Footer): زانیاریێن ڤێ پشکێ ل دوماهیا بەرپەڕێ دوماهیکێ دهێنە بەرچاڤکرن، وەك نموونە بۆ دیار کرنا ئەنجامێن کۆرتیا راپۆرتێ دهێتە بکارئینان.

٣- دێ ئایکۆنێ ( View) کلیك کەین راپۆرتا هاتیە دیزاینکری دێ بڤی شێوەی بەرچاڤببیت.



## *Report Wizard

بكارئينانا ڤێ رێكى راپۆڕت بڤى شێوەى دهێنە دروستكرن:

١- (Report Wizard) كليكدكەين، خشتە يان پرسگەها مەبەست پێ دەستنيشاندكەين. پاشان دۆگما ( OK ) كليكدكەين.




٢- بۆكسەكا نوى بەرچاڤدبيت، ئەگەر د خالا (١) دا خشتە يان پرسگەه نەهاتبيتە دەستنيشانكرن دشياندايە دڤێ بۆكسێدا دەستنيشانبكەين، فيلدێن مەبەست پێ بەرچاڤبن د راپۆڕتێدا دێ هێنە هنارتن بۆ خانەيا (Selected Fields) برێيا ئايكۆنێن هنارتن وڤەگەريانێ هەر وەكو ديار دوێنەيدا.



٣- دۆگما (Next) كليكدكەين، بۆكسەكا نوى بەرچاڤدبيت، دشياندايە برێيا ڤێ بۆكسێ زانياريێن خۆ پۆلينبكەين، ئەوژى بهنارتنا فيلدێ پێدڤى بۆ لايێ راستێ برێيا ئايكۆنێن دخالا (٢)دا هاتينە ديار كرن.




٤- دۆگما (Next) كليكدكەين، ئەڤ بۆكسا لخوارێ ديار كرى بەرچاڤدبيت، كو دشياندايە رێزبەنديا زانياريان لدووڤ فيلدەكى بۆ دەستنيشانبكەين. هەروەكو ديار د وێنەيدا. بۆ تێبينى دشياندايە چ فيلدان دڤێ بۆكسێدا دەستنيشان نەكەين ب وێ چەندێ زانياريێن مە نەرێزبەندكرى بەرچاڤدبن.



٥- دۆگما (Next) كليكدكەين، ئەڤ بۆكسا لخوارێ ديار كرى بەرچاڤدبيت، كو دشياندايە شێوازێ راپۆرتێ دەستنيشانبكەين، ژ ئاليێ شێوەيێ راپۆرتێ (ناڤ ونيشان و ناڤەرۆك) و ژ ئاليێ راپۆرت بشێوەيەكێ پانيى يان بلنداهى بيت.




٦- دۆگما (Next) كليكدكەين، ئەڤ بۆكسا لخوارێ ديار كرى بەرچاڤدبيت، كو دشياندايە برێيا وێ ستايلێ پێدڤى بۆ راپۆرتێ دەستنيشانبكەين.



٧-دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت، کو دشیاندایە برێیا وێ راپۆرتا خۆ بناڤ بکەین.




٨-دۆگما (Finish) کلیکدکەین، راپۆرتا مە دێ بقی شێوەی بەرچاڤبیت:



## *Auto Report :Columnar

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا راپۆرتەکێ بشێوەیەکێ ستووینی دهێتە بکارئینان.

پێنگاڤێن ڤێ رێکێ بڤی شێوەینە:

١- (Auto Report: Columnar) کلیکدکەین، خشتە یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشان دکەین.




٢-بکلیککرن لسەر دۆگما ( OK ) راپۆرتا مە دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت.




## Auto Report: Tabular *

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا راپۆرتەکێ بشێوەیێ خشتەیەکی دهێتە بکارئینان.

پێنگاڤێن ڤێ رێکێ بڤی شێوەینە:

١-(Auto Report : Tabular) کلیکدکەین، خشتە یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشان دکەین.



٢-بکلیککرن لسەر دۆگما (OK) راپۆرتا مە دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت



## Chart Wizard *

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا راپۆرتەکێ بشێوێ هێلکاری دهێتە بکارئینان.

١- (Chart Wizard) کلیکدکەین، خشتە یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشان دکەین.



٢- دۆگمە (OK) كلیكدكەین ئەڤ بۆكسە بەرچاڤدبیت، كو دشیاندایە فیلدێن مەبەست پێ بۆ راپۆرتا هێلكاری دەستنیشانبكەین و ڤەگوهێزینە لایێ (Fields For Chart) هەروەكو دیار د وێنەیدا.




٣- دۆگمە (Next) كلیكدكەین، ئەڤ بۆكسە بەرچاڤدبیت كو دشیاندایە شێوەیێ هێلكاری دەستنیشانكەین.



٤- دۆگمە (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە فیلدان برێیا راکێشان وبەردانێ بۆ تۆڕا هێلکاری رابکێشین لدووڤ حەزا مە.




٥- دۆگمە (Next) کلیکدکەین، بۆکسا دۆماهیێ بەرچاڤدبیت، کو دناڤدا پێدڤییە ناڤەکی بدەینە راپۆرتێ.



٦- دۆگما (Finish) کلیکدکەین، راپۆڕتا مە دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:



# چەوانیا رێکخستن وچارەسەرکرنا بنکا زانیاریان

بۆ بچووك کرنا قەبارێ دووسەیا بنکا زانیاریان(داتابەیسێ) و چارەسەرکرنا وێ کو هندەك جاران وەکو هێما زانیاریان بەرچاڤدکەت یان هەر ئاریشەکا دی کو تۆشی داتابەیسێ دبیت، بۆ ئەنجامدانا ڤان هەردوو کاران (بچووککرنا قەبارەی و چارەسەرکرن) دێ ڤان رێکا بکارئینین:

دناڤ دووسەیا بنکا زانیاریان دێ لیستەیا (Tools) ڤەکەین، پاشان دێ (Database Utilities) هەلبژێرین و پشکا (Compact and Repair Database) کلیك کەین بشێوەیەکێ زێندی دێ دووسەیا مە هیتە ڤشارتن و چارەسەریا ئارێشەیان دهێتە ئەنجامدان.

# Startup

مفا ژ ڤی فەرمانی دهێتە وەرگرتن بۆ  ڤەکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکێ ئێکسەر ددەمێ داتابەیسا مە ژ گەلەك پشکان پێك بهێت، ئەو فۆرما دهێتە دەستنیشانکرن وەك Startup دێ زانیاریان یان دۆگمەیان لسەر ئامادەکەین ژبۆ چوون و دەرکەفتنێ ژناڤ فۆرمێن دی یێن پرۆگرامی، وبشێوەیەکی دی دبێژنە ڤێ فۆرمێ (دارا لقان).

بۆ دانانا فۆرمەکێ وەك Startup دێ ڤان پێنگاڤان بکارئینین:

١-دێ دووسەیا داتابەیسێ ڤەکەین، لیستا ( Tools ) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت.




٢-دناڤ پشکا(Displayform/page) فۆرمێ مەبەستپێ دەستنیشاندکەین و پاشان دێ دۆگما (OK) کلیك کەین.

هەردەمەکێ ئەڤ دووسەیا دهێتە ڤەکرن دێ ئێکسەر ئەڤ فۆرمە هێتە بەرچاڤکرن.

## راهێنان

پ١/(داتابەیسەکێ Database) دناف درایڤێ (D) دا بناڤێ (لیستا مووچەیان) ڤەگرە، پاشان بەرسڤا ڤان لقێن لخوارێ دیارکری بدە:

أ- ئەڤ خشتەیێ لخوارێ دیار کری بڕێیا (Design View) دروستبکە،پاشان بناڤێ (ئازادی) ڤەگرە، جۆرێ فۆنتی بکە (Ali_K_Samik) ب قەبارێ (١٦).

| ز | ناڤێ سێ قولی | باوەرنامە | مووچە | پیشە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | جوان احمد سليم | بەکەلوریوس | ٧٠٠٠٠٠ | مامۆستا |
| ٢ | پيمان محمد عبدالله | دبلوم | ٦٥٠٠٠٠ | مامۆستا |
| ٣ | سلاح جميل ابراهيم | ماستەر | ١٢٠٠٠٠٠ | مامۆستا |
| ٤ | حميد حسين سعيد | بەکەلوریوس | ٩٠٠٠٠٠ | ئەندازیار |
| ٥ | دلين اسماعيل حسن | بەکەلوریوس | ٧٠٠٠٠٠ | پارێزەر |
| ٦ | احمد على حسين | دبلوم | ٥٣٠٠٠٠ | فەرمانبەر |

پاشان مووچەیێن دووبارە ژێك جۆدا بکە.

ب-راپۆرتەکێ بڕێیا (Report Wizard) لسەر خشتەیێ (ئازادی) دروستبکە و بناڤێ (کۆردستان) ڤەگرە.

ج- ئەڤ خشتەیێ لخوارێ دیار کری برێیا پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت ئێکسل دروستبکە، جۆرێ فۆنتی بکە (Ali_K_Samik) ب قەبارێ (١٦)، دناڤ درایڤەکیدا بناڤێ (سەربەستی) ڤەگرە، پاشان برێیا (Import Table) بینە دناڤ پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت ئەکسسی دا و بهەمان ناڤ ڤەگرە.

| مووچە | ناڤێ سێ قولی | ز |
|---|---|---|
| ٥٠٠٠٠٠ | زەینەب رسول محمد | ١ |
| ٧٥٠٠٠٠ | ئەلند حسین جمال | ٢ |
| ١٠٠٠٠٠٠ | پەروەر کریم جادر | ٣ |
| ٩٠٠٠٠٠ | دلوار سعید محمد | ٤ |

د- فۆرمەکی برێیا ( Form Wizard) لسەر خشتەیێ (سەربەستی) بتنێ بۆ فیلدێن (ناڤێ سێ قولی و مووچەی) دروستبکە، پاشان ب هەمان ناڤ ڤەگرە.